# شەش هەڵەی کوشندە لە

# فـــێربوونـــی زمـــاندا

## ڕاهێنەر نەزمی قادر

ناونیشانی تۆری کۆمەڵایەتی (فەیس بوك)

ڕاهێنەری باوەڕپێکراوی سەنتەری جیهانی کەنەدی : نظمي قادر

https://www.facebook.com/nezmi.qadrtawelley

سەرنج !!! لەسەرەتای خوێندنەوە نەکەویتە داوی کەمی بابەتەکە وە دەرونت فریوت نەدات بەوەی کە بلێیت :( ئەم هەڵانە چارەسەری کێشەکان ناکەن ! ) نەکەویتە داوی ترسی دەرونت .

**فێرخوازانی زمان دوچاری کام یەك لەم هەڵانە دەبن ؟**

**کام هەڵە هۆکارە بۆ سستی لەفێربونی زمان ؟ بۆچی ئەم هەڵانە ڕوو ئەدەن ؟**

**ئەوانەی کە هەوڵی بەردەوام ئەدەن لە فێربوونی زمان بەڵام ئە نجامەکەی بە دڵی خۆی نییە ، زۆرێکیان بێ ئاگان لەم هەڵە کوشندانە ، هەرئەمەیش وای کردوە کاریگەری نەرێنی بکاتە سەر فێربوونی زمان .**

**هەڵەی یەکەم / گرنگی و سەرنجدانی لە ڕادەبەدەر بۆ سەر گرامە : تۆ کاتێك فێری زمانی دایك بویت هیچکات بە شێوەی گرامەر ڕستەکانت بۆ ڕون نەکرایەوە لە لایەن دەوروبەرکەتەوە ، تۆ تەنها گوێت ئەگرت و قسەکانت ئەبیست ، پاش ئەوەی تەمەنت گەیشتە 4 ساڵی و فێری قسەکردن بویت لە ڕوی ڕێزمانیەوە هیچ کێشەت نەبوو بـــــەڵام بۆچی ئێستا بۆ فێربونی زمانی دووەم لە گرامەرەوە دەست پێ ئەکەیت ؟! گرامەر ئاڵۆزترین بەشی زمانە .**

**ئایا ئەزانیت لە تاقیکردنەوە جیهانیەکانی وەك تــۆفـــڵ ،ئایاڵس و ... لەم سالانەی کۆتایی هەستیان بەم هەڵەیە کردوە بۆیە بەشی گرامەریان لە تاقیکردنەوەکان لابردوە .**

**هەڵەی دوەم / زۆر لە خۆکردن بۆ قسەکردنی پێش وەخت : گفتوگۆکردن بە زمانی دوەم لە دوای فێربوونی ئاڵۆزترین ئۆرگانی مێشکە ، کە چەندین سیستمی مێشك وجەستە بە خۆیەوە خەریك ئەکات . تۆیش لەسەرەتاوە زۆر لە خۆت ئەکەیت بۆ گفتوگۆکردن ئەمەیش بێ متمانەیی تۆ زیاتر ئەکات لە فێربونی زماندا ، زیاتر گوێ بگرە پاڵە پەستۆ مەخەرە سەر خۆت .**



**هەڵەی سێیەم / خۆ خەریك کردن بە فێربونی زمان لە کتێبەکان : ئەوەی لە کتێبەکاندا هەیە جیاوازە لە قسەی ڕۆژانە و فیلمەکان ، لە ڕۆژانەدا زیاتر وشەی گفتوگۆکردن بەکار ئەبرێن ئەم وشانە نزیکەی 1000 وشە ئەبن (ئێمە لە خۆلەکانماندا بەشداربون فێری ئەم وشانە ئەکەین) ،کەواتە تەرکیزت زۆر مەخەرە سەر فێربوون لە کتێبەکاندا .**

**هەڵەی چوارەم / هەوڵدان بۆ نەبونی کەمو کورتی لە زماندا : تەرکیزی زۆری مامۆستایان لەسەر هەڵەی فێرخوازانە وە بەردەوام خەریکی چاکسازی کردنی ئەم کەمو کورتیانە ، کاتێکی زۆر ئەبات و بەشداربوان توشی بێ هیوایی ئەکات ،شکسپیر نەیوانیوە خۆی لە هەموو کەموکورتیەکانی زبان ڕزگار بکات ئایا تۆ ئەتوانی ؟!**

**هەڵەی پێنجەم / پشت بەستنی تەواو بە خولی زمان : هەڵەی فێرخواز ئەوەیە فێربونی زمان بە تەواوی ئەخاتە ئەستۆی سەنتەر و ڕێکخراوەکان و ...ئەمە هەڵەیەکی ترسناکە ، تۆ ئەتوانیت بەبێ بەشداری کردن لە خول لە ماڵەوە خۆت فێری زمان ببیت ، فێربونی زمان پێویستی بە ڕاهێنان هەیە کە لە ماڵەوە ئەتوانی ئە نجامی بدەیت .**

**هەڵەی شەشەم / سود وەرگرتنی بێ سنور لە قاموس : گەرانە بە دوای هەر وشەیەك کە واتای نازانیت بەشێك لە وزە و توانات ئەبات بۆ فێربونی زمان ، هەتا وشەیەك بە تەواوی فێری نەبوی بیخوێنیتەوە یان بیناسیتەوە لە قاموس بۆ واتاکەی مەگەرێ .**

**بەشداربویەك بۆی گێرامەوە وتی من هەرکە دەستم کرد بە فێربونی زمان زو بێزار ئەبم چی بکەم ؟! .... وتم : چەند لە کاتی خۆت سەرف ئەکەیت بەدوای گەران بە شوێن واتای وشەکاندا تا واتای گونجاو بدۆزیتەوە ؟! ... وتی : زۆرینەی کاتی دیاریکراو بۆ فێربونی زمان تەرخان ئەکەم بۆ واتای وشەکان ئەوەیش بەکار هێنانی قاموس ... وتم : ئەوە کێشەی تۆیە ... پاشان کێشەکەی چارەسەر بوو .**

---

## وێنەی خولی بەهێزکردنی تواناى فێربوونی زمان و ستراتیجەتی فێربوون

### له سلێمانی و هەڵەبجە





## لە گەڵ ئێمەدا هەمیشە ڕێگەی ئاسان هەڵبژێرە بۆ فێربوونی زمان